حکومەتی هەرێمی کوردستان- عێراق
وەزارەتی پەروەردە - بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# زانست بۆ هەمووان ٣



## پۆلی سێیەمی بنەڕەتی

## کتێبی ڕاهێنان









چاپی نۆیەم
٢٠١٥ز /٢٧١٥کوردی /١٤٣٦ هـ

# ناوەڕۆك

ناو ____________ بەروار ____________

## یەکەی یەکەم بەندی ١ • ڕێکخەری زانیارییەکانی چەمکەکانی بەندەکە

| جۆرەکانی زیندەوەران | | | | |
|---|---|---|---|---|
| وانە ١<br>جۆرەکانی ڕووەك چین؟ | | پێداویستییەکانی تۆو بۆ گەشە کردن چییە؟<br>١. ____<br>٢. ____ | ڕووەکەکان گەشە دەکەن بە<br>١. ____<br>٢. ____ | بەشەکانی تۆو بریتییە لە<br>١. ____<br>٢. ____<br>٣. ____ |
| وانە ٢<br>شیردەرەکان و باڵندەکان چین؟ | | داپۆشراوە بە | هەناسە دەدات بە | چۆن لەدایك دەبێت |
| | شیردەرەکان | ١. ____ | ٢. ____ | ٣. ____ |
| | باڵندەکان | ٤. ____ | ٥. ____ | ٦. ____ |
| وانە ٣<br>وشکاوەکی و ماسی و خشۆکەکان چین | | داپۆشراوە بە | هەناسە دەدات بە | چۆن لەدایك دەبێت |
| | وشکاوەکی | ١. ____ | ٢. ____ | ٣. ____ |
| | ماسی | ٤. ____ | ٥. ____ | ٦. ____ |
| | خشۆك | ٧. ____ | ٨. ____ | ٩ ____ |

تۆماری لێکۆڵینەوە

ناو ______________________

بەروار ______________________

# ڕووانی تۆوەکان

## کەرەستەکان


٣ جۆر تۆو


دەستەسڕی کاغەز


٣ توورەگەی بچووك کە دەتوانرێت دابخرێت


مقەست


ئاو


شریتی لکێن


هاوێنەی گەورەکردنی دەستی

## هەنگاوی چالاکییەکە

1. پێوانە و شێوە بەکار بهێنە بۆ پۆلێن کردنی بڕێکی کەم لە تۆوەکان بۆ سێ کۆمەڵ.
2. دوو دەستە سڕی کاغەز لە ناوڕاستیاندا ببڕە سێ پارچەیان لێ بنووشتێنەوە بۆ ئەوەی لە ناوکیسە نایلۆنەکاندا دایان بنێیت .بڕێکی کەم ئاو بەکاربهێنە بۆ تەڕکردنی دەستەسڕەکان .
3. هەر کۆمەڵە تۆوێك لە کیسەیەکدا دابنێ و دایبخە. کیسەکان بە ١و٢و٣ ڕەنووس بکە کیسەکان بلکێنە بەبەشی ناوەوەی پەنجەرەیەکەوە بە هۆی شریتی لکێنەوە.
4. هاوێنەی گەورەکردنی دەستی بەکاربهێنە بۆ سەرنجدانی تۆوەکان ڕۆژانە بۆماوەی (١٠) ڕۆژ. ئەم خشتەیەی خوارەوە وخشتەکەی لاپەڕەی داهاتوو بەکار بهێنە بۆ تۆمارکردنی تێبینیەکانت.

| تۆو | ڕۆژەکان | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |
| کۆمەڵەی ١ | | | | | |
| کۆمەڵەی ٢ | | | | | |
| کۆمەڵەی ٣ | | | | | |

ناو ________________

تۆماری لێکۆڵینەوە

| تۆو | ڕۆژەکان | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ |
| کۆمەڵەی ١ | | | | | |
| کۆمەڵەی ٢ | | | | | |
| کۆمەڵەی ٣ | | | | | |

## دەرئەنجام

١. ئەو گۆڕانانە چین کە لەسەر تۆوەکان **تێبینیت کردووە** ؟

________________

________________

٢. چۆن خێرایی گۆڕانەکان جیاواز بوون کەبەسەر سێ کۆمەڵەکە دادێت ؟

________________

٣. **زاناکان چۆن کار دەکەن** زاناکان بەوردی **سەرنجی** لێکۆڵینەوەکانیان دەدەن بۆئەوەی زانیاری نوێیان دەستبکەوێت . سەرنجدانی تۆوەکان چۆن یارمەتی دای بۆ ئەوەی زیاتر لە تۆوەکان بگەیت؟

________________

________________

کارامەییە کردەییەکانی
زانست

ناو ________________

بەروار ________________



# سەرنج بدە

دەتوانیت ڕاستەوخۆ بەهۆی هەستەکانتەوە سەرنج بدەیت ، بەڵام دەتوانیت لە هەمان کاتدا مایکرۆسکوبێك یان هاوێنەیەکی گەورە کردنی دەستی بۆسەرنجەکانت بەکاربهێنیت. .سەرنجدان یەکێکە لە کارامەییە سەرەکییە کردەییەکانی زانست.

**بیر لەتێبینی بکەرەوە**

تۆ نەخشە دادەنێیت بۆ چاندنی ڕووەکەکان لە باخچەیەکدا . هەر بۆئەو مەبەستە داوات لە کۆمپانیایەك کرد کەتۆوی کاڵەکی سوور وگەنمەشامی وفاسۆلیا و خەیارت بۆ بنێرێت. کۆمپانیایەکە تێکەڵەیەکی لەو تۆوانە بۆناردیت کەلەقوتوویەکدا دانرابوون. لەگەڵ قوتووەکە دا وێنەی رەنگاورەنگی ئەو تۆو و ڕووەکانەی لەگەشەکردنی تۆوەکانەوە پەیدا دەبن هاتبوو . دەتوانیت کارامەیی تێبینیت بەکاربهێنیت بۆناسینەوەی ئەو جۆرە تۆوانە .

١. لەسەر ڕووی مێزێك تۆوەکان بڵاوبکەرەوە کام هەست بەکاردەهێنیت بۆ سەرنجدانی تۆوەکان؟

________________________________

٢. تۆوەکان لەچیدا لەیەکتر جیاوازن ؟

________________________________

٣. چۆن هاوێنەی گەورەکردنی دەستی یارمەتی سەرنجەکانت دەدات ؟

________________________________

٤. باسی بکە کەچی دەکەیت بۆ دەرخستنی لە یەکچوون لە نێوان ئەو تۆوانەو تۆوەکانی دیکەدا.

**هەنگاوی ١**: ________________________

**هەنگاوی ٢**: ________________________

**هەنگاوی ٣**: ________________________

٥. سەرنجدان چۆن یارمەتیت دەدات بۆ ناسینەوەی تۆوەکان؟

________________________________

پێداچوونەوەی چەمکەکان

ناو ______________

بەروار ______________

# جۆرەکانی ڕووەك چیین؟

## چەمکەکانی وانەکە

ڕووەکە سادەکان و هەندێ جۆری دیکەی ڕووەك بە سپۆڕکردن زۆردەبن. بەڵام جۆرەکانی دیکەی ڕووەك بە یارمەتی تۆو زۆردەبن. تۆ چەکەرە دەکات وە لە دواییدا گەشە دەکات و دەبێتە ڕووەکێکی نوێ.

## زاراوەکان

ڕووەکە سادەکان(١٤) تۆو(١٥) ڕووان(١٦) چەکەرە(١٦) نێرەك(١٨)
مێیەك «کەرپەلە» (١٨)

**بۆشاییەکان بەبەکارهێنانی ئەو زاراوە گونجاوانە پڕبکەرەوە.**

______ بە سپۆڕکردن زۆردەبن، بەڵام هەندێك لەو ڕووەکانەی کە ڕەگ و قەد و گەڵایان هەیە. ______ بەرهەم دەهێنن بۆ دروستکردنی ڕووەکی نوێ.
تۆو لە ناوگوڵدا لە بەشی خوارەوەی ئەندامی ______ پەیدا دەبێت و هەندێك ڕووەك دەتوانێت گەشە بکات لە بەشەکانی دیکەی ڕووەکەکە جگە لە تۆ.
تۆوەکان گەشەدەکەن بۆ پێکهێنانی ڕووەکێك، کە لەو ڕووەکە پێگەیشتووە دەچێت کە لێی پەیدابووە.
تۆوەکان هەمان پێکهاتنیان هەیە تۆوەکان پێویستیان بە ئاو هەیە بۆ ______ تا بگۆڕێن بۆڕووەکێکی نوێی بچووك کەپێ ی دەووترێ ______ .

**بازنەیەك بە دەوری ئەو بەشەی ڕووەك بکێشە کە تۆویان تیا دروست دەبێت لەهەر وێنەیەك.**





**ئەم ڕستانەی خوارەوە بە ڕەنووس ڕێك بخە.**

______ چەکەرە بە خاکدا ڕۆدەچێت.
______ گەڵاکان دەست بەگەشە دەکەن.
______ ڕەگ لە تۆوەوە گەشەدەکات.

تۆماری لێکۆڵینەوە

ناو ______________________

بەروار ______________________

# فەروو یارمەتی گیانەوەران دەدات

## کەرەستەکان




کەتیرە «جەوی»



دوو قوتووی کانزا



ناواخنی لۆکە



ئاوی گەرم



دوو گەرمیپێو



کاتژمێر

## هەنگاوەکانی چالاکی

وریابە

١ تۆماری تێبینیەکانت دەکەیت لەو خشتەیەی کە لەلاپەڕەی بەرامبەردا هاتووە.

٢ کەتیرە لە قوتوێك بدە. ئینجا چینێکی ئەستور لە پەمۆ پێوە بلکێنە تا دایدەپۆشی. سەیر بکە تاوەکو کەتیرەکە وشك دەبێتەوە. پەمۆیەکە بەدەستت بڵاو بکەوە.

٣ ئاگاداربە **وریابە لە ئاوی گەرم لەوانەیە بتسوتێنێ**. مامۆستایەکەت هەردوو قوتیەکان پڕ دەکات لە ئاوی گەرم.

٤ پێوەری گەرمی لەناو هەر قوتویەك دابنێ. **تۆماری** پلەی گەرمی ئاوەکە بکە.

٥ پلەی گەرمی ئاوی ناو هەردوو قوتووەکان چاودێری بکە هەر ١٠ خولەك. بۆ ماوەی ٣٠ خولەك. **تۆماری** پلەی گەرمی بکە لە خشتەکەدا.

تۆماری لێکۆڵینەوە

ناو ______________________

| کات | پلەی گەرمی ئاوی ناو قوتووە کە بە لۆکە داپۆشراوە | پلەی گەرمی ئاوی ناو قوتووە کە بە لۆکە دانەپۆشەراوە |
|---|---|---|
| سەرەتا | | |
| ١٠ خولەك | | |
| ٢٠ خولەك | | |
| ٣٠ خولەك | | |

## دەرئەنجام بکە

١. لەکام قوتووێکیاندا ئاو بە گەرمیی ماوەتەوە بۆماوەیەکی زیاتر؟ وە بۆچی؟

______________________

٢. چۆن فەرووی گیانەوەر بە لەبەرکردنی چاکەت لە مرۆڤ دەچێت؟

______________________

______________________

٣. **زاناکان چۆن کاردەکەن**، زاناکان زۆر جار نموونەیەك بەکاردەهێنن بۆلێکوڵینەوە لەوشتانەی کەناتوانرێت بە ئاسانی ببینرێت. لەم چالاکییەدا نموونەی گیانەوەرێکی بە فەروو داپۆشراوت دروست کرد. چی وا دەکات کە بەکار هێنانی نموونەکە ئاسانتربێت وەك لە تێبینی کردنی گیانەوەرەکە خۆی.

______________________

______________________

ناو ____________

بەروار ____________

# نموونەیەك بەكار بهێنە

لە وانەیە بەکارهێنانی نموونە بۆلێکۆڵینەوەی شتەکان یارمەتیت بدات کە تێبینی کردنی شتەکان راستەوخۆ ئاسان نیە.

## بیر لە بەکارهێنانی نموونەیەك بکەرەوە

ڕەنگی پێستی ورچی جەمسەرەکانی زەوی، ڕەشە، پێستی ورچی جەمسەرگەرمی خۆر دەمژێت، بریارِ بدە کە نموونەیەك دروست بکەیت، بۆ دڵنیابوون لەم بیرۆکەیە، لەڕۆژێکی گەرمی خۆرەتاو، چوار کلۆ سەهۆڵ لە بەفر گرەکە دەربهێنە، دووانیان نایلۆنی رەش و دووانەکەی تریان نایلۆنی سپییان پێوە بپێچە و، هەردوو پێچراوەکە بخەرە سەر سینییەك و لەبەر هەتاو دایان بنێ، دەتەوێ بزانیت کام کلۆ سەهۆڵ خێراتر گەرمی دەمژێت، چاودێری کات بکە، بۆ ئەوەی بزانیت کامیان زووتر دەتوێتەوە، هەر پێنج خولەك جارێك دەست بدە لە هەردوو پێچراوەکە، دەبینیت سەهۆڵە نایلۆنی رەشپۆشەکە لە سپییەکە زووتر دەتوێتەوە.

١. بۆچی نموونەیەك بەکار دەهێنیت بۆ ئەوەی بزانیت کەپێستی ورچی جەمسەر گەرمی دەمژێت؟ ____________

٢. ئەو تێبینیانە چین کە دەتوانێت بە جێیان بهێنیت ؟ ____________

____________

____________

٣. ئەو بەراوردانە چین کەلە نێوان دوو کۆمەڵە سەهۆڵەکەدا دەتوانیت بە جێیان بهێنیت ؟

____________

____________

٤. تێبنییەکانت بەکاربهێنە بۆ ئەوەی بزانیت کە دوو کلۆ سەهۆڵ داپۆشراو بە نایلۆنی ڕەش زووتر دەتوێتەوە لە دووکلۆ سەهۆڵەکەی تر کە بەنایلۆنی سپی داپۆشراون.

____________

____________

٥. لەو نموونەیەوە، دەتوانی چی بزانیت، دەربارەی پێستی ورچی جەمسەر؟

____________

____________

پێداچوونەوەی چەمکەکان

ناو ______________

بەروار ______________

# شیردەرەکان «مەمکدارەکان» و باڵندەکان چیین؟

## چەمکەکانی وانەکە

زۆربەی شیردەرەکان، بەفەروو یان بەموو داپۆشراون و بێچوویان دەبێت . زۆربەی باڵندەکان بەپەڕداپۆشراون و هێلکە دەکەن و بەترووکاندن بێچووەکانیان لێ دێتە دەرێ.

## زاراوەکان

| | |
|---|---|
| **شیردەرەکان(٢٢)** | **باڵندەکان(٢٥)** |

**وەڵامی ڕاست بۆ هەر ڕستەیەك هەڵبژێرە وە ئەوپیتە بنووسە کە لەگەڵ دەنگوبجێ لەوانەیە لەوەڵامێکی گونجاو زیاتر هەبێت بۆ هەر ڕستەیەك.**

______ ١. سیفەتی هاوبەشە لە نێوان شیردەرەکاندا.

______ ٢. باڵندەکان پۆلیندەکرێن بەپێی شێوەی ئەو سیفەتانە.

______ ٣. لەشی زۆربەی باڵندەکانی پێداپۆشراوە.

**أ.** پەڕ

**ب.** فەروو یان موو

**ج.** جووتێك سی بۆهەناسەدان

**د.** بێچوویان دەبێت

**هـ.** دەنووك

**و.** بێچووەکانیان بەوشیرە بەخێودەکەن کە لەناو لەشیاندا بەرهەم دێت

**ز.** پێیەکان.

**پیتی (ش) بنووسە لە ژێر وێنەی هەر شیردەرێکدا وە پیتی (ب) لەژێر هەر باڵدارێکدا بنووسە.**



١. ______



٢. ______



٣. ______



٤. ______



٥. ______



٦. ______

تۆماری لێکۆڵینەوە

ناو ______________________

بەروار ______________________

# لە هێلکەوە بۆ بۆق

## کەرەستەکان



چەو



حەوزی ماسی



ئاو



ڕاستە



ڕووەکی ئاوی



تاوێر



کۆمەڵێك لە سەرە مێکوتە



خۆراکی وشککراوەی ماسی

## هەنگاوەکانی چالاکییەکە

❶ چینێك چەو لە بنی حەوزێك دابنێ. ١٢ تا ١٥ سنتیمەتر ئاوی لەسەر ئەو چینەوە تێ بکە.

❷ چەند ڕووەکێکی ئاوی لە ئاوەکەدا دابنێ بۆئەوەی سەرئاو بکەون هەندێکی تریان بچەقێنە بە چینە چەوەکەدا. پاشان تاوێر لە سەر چینە چەوەکە دابنێ وا پێویست دەکات تاوێرەکە گەورەبێت بۆ ئەوەی بۆقەکان بتوانن لەسەری بووەستن و لە دەرەوەی ئاوەکەبمێننەوە.

❸ دوو سەرەمێکوتە لە ئاوەکەدا دابنێ. حەوزەکە لە شوێنێکدا دابنێ کە بە شێوەییەکی ناڕاستەوخۆ بەر تیشکی خۆر بکەوێت.

❹ ڕۆژانەخۆراکی وشکی ماسی بدە بە سەرەمێکوتەکان، هەفتانە جارێك بڕێك لە ئاوی سازگار بکە حەوزەکەوە.

❺ ڕۆژانە **تێبینی** بێچووە بۆقەکان بکە وە هەر وەك چۆن دەردەکەون هەفتانە جارێك وێنە یان بۆ بکێشە. بۆ ئەو مەبەستە خشتەکەی خوارەوە وخشتەی لاپەڕەی دواتریش بەکار بهێنە.

| | تێبینییەکان | وێنە |
|---|---|---|
| ڕۆژی١ | | |
| ڕۆژی٢ | | |
| ڕۆژی٣ | | |
| ڕۆژی٤ | | |
| ڕۆژی٥ | | |

تۆماری لێکۆڵینەوە

ناو ______________________

| | تێبینییەکان | وێنە |
|---|---|---|
| ڕۆژی ٦ | | |
| ڕۆژی ٧ | | |
| ڕۆژی ٨ | | |
| ڕۆژی ٩ | | |
| ڕۆژی ١٠ | | |
| ڕۆژی ١١ | | |
| ڕۆژی ١٢ | | |
| ڕۆژی ١٣ | | |
| ڕۆژی ١٤ | | |
| ڕۆژی ١٥ | | |

## دەرئەنجام بکە

١. ئەوگۆڕانکارییانە چین کە لەکاتی گەشەکردنی سەرەمێکوتەدا تێبینیت کردن؟

______________________

______________________

٢. لەشی سەرەمێکوتەکان چۆن دەردەکەون لەوکاتەدا کە لە ئاوەکەوە دەردەچنە دەرەوە ؟

______________________

______________________

٣. **زاناکان چۆن کار دەکەن** **زاناکان ئەوەی دەیبینن** تۆماری دەکەن. چۆن تۆمارکردنی تێبینییەکان یارمەتی فێربوونی دایت دەربارەی گەشەی بێچووی بۆق؟

______________________

______________________

کارامەییە کردەییەکانی
زانست

ناو ______________________

بەروار ______________________

# سەرنج بدە و تۆماربکە

کاتێك سەرنجی شتێك دەدەیت تۆ هەستی بینین و بیستن و بۆنکردن و چەشتن بەکار دەهێنیت . دەتوانیت تێبینییەکانت تۆماربکەیت.

## بیر لەسەرنجدان و تۆمارکردن بکەوە

ئاسۆ حەوزێکی شووشەی ڕوونی هەیە بۆماسی بەخێو کردن ماسی ناوچەی هێڵی کەمەرەی تێدایە. ڕۆژێك ئاسۆ سەرنجی دا، کە ماددەیەکی سەوز شووشەی ماسی بە خێو کردنەکەی داپۆشیووە . دەنگێکی بەرزیش لە پاڵێوەرەکەوە بەرز دەبێتەوە بۆنێکی ناخۆشیش لە ئاوەکە دێت ئاسۆ هەستی بە ساردی دیواری حەوزە شووشەکە کرد هەروەها گوێ لە دەنگی ئامێری هێشتنەوەی ئاوەکە بە شێوەی شلەتێن نەدەبوو.

١. چەندجار، ئاسۆ یەکێك لە هەستەکانی بۆ سەرنجدانی حەوزی بەخێوکردنەکە بەکارهێناوە ژمارەی کەڕەتەکان لە ستوونەکەدا تۆماربکە.

| بینین | بیستن | بۆنکردن | بەرکەوتن | چەشتن |
|---|---|---|---|---|
| | | | | |

٢. ئەوەی ئاسۆ بەچاوی بینی، تۆماری بکە.

**بینی کە** ______________________

٣. **ئەوانە** تۆمار بکە کە ئاسۆ بیستوویەتی (یان نەیبیستووە) .

بیستی کە ______________________

نەی بیست ______________________

٤. **ئەوەی** ئاسۆ بۆنی کرد یان بەری کەوت یان چەشتی تۆماربکە.

بۆنکردنی ______________________

بەرکەوتنی ______________________

چەشتنی ______________________

٥. ئەو تێبینییانە بەکاربهێنە بۆ دیارکردنی ئەو پەککەوتنانەی کە لە بەخێوکردنەکەدا ڕوویان داوە. ______________________

______________________

پێداچوونەوەی
چەمکەکان

ناو ________________

بەروار ________________

# وشکاوەکی و ماسی وخشۆکەکان چیین؟

## چەمکەکانی وانەکە

ژیانی وشکاوەکی لەئاوەوە دەست پیێ دەکات ،ماسی هەموو ژیانی لەناو ئاودا دەباتە سەر خشۆکەکان لەسەر وشکانی دەژین.

## زاراوەکان

| | | |
|---|---|---|
| **وشکاوەکییەکان (٣٠)** | **تویێکڵ (٣٢)** | **خشۆکەکان (٣٣)** |
| **ریشووەکان (٣١)** | **پەڕەکە (٣٢)** | **پوولەکەکان (٣٣)** |
| **ماسییەکان (٣٢)** | | |

**بەبەکارهێنانی زاراوەی گونجاو ، بۆشایی پڕبکەرەوە:**

گیانەوەران ژیانیان لە ئاودا دەست پێدەکات، دواتر شێوەیان دەگۆڕێت، پاشان دەچنەوە سەر وشکانی. ئەم گیانەوەرانە بریتین لە __________ . __________ ژیانیان لە ئاودا دەبەنە سەر، لەشیان بە __________ داپۆشراوە، هەروەها __________ بەکار دەهێنن بۆ هەناسەدان. وە __________ یارمەتیان دەدات لە مەلەکردندا. __________ گیانەوەرن لە وشکانی دەژین، پێستێکی وشکیان هەیە یان بە __________ دادەپۆشرێن.

**لەژێر وێنەی هەر یەکە لەم گیانەوەرانە زاراوەیەکی گونجاو لەم زاراوانە بنووسە. وشکاوەکی ، ماسی، خشۆك، دەوری ئەو گیانەوەرانە بازنەدار بکە کە کەوانەی ڕیشووەداریان هەیە لە هەندێك لە قۆناغەکانی ژیانیاندا . نیشانەی ✔ دابنێ لەسەر ئەو گیانەوەرانەی هەمیشە بە سی هەناسە دەدەن .**


مارمێلکە

١. ________________


سەرەمێکوتە

٢. ________________


ماسیسەلەموون

٣. ________________


کیسەڵ

٤. ________________


قرش

٥. ________________


بۆق

٦. ________________

ناو ______________

بەروار ______________

# زاراوەکان بناسە

**وەڵامی گونجاو بۆهەر ڕستەیەك هەڵبژێرە و ئەو پیتە بنووسە، کە بۆی دەبێت.**

| | |
|---|---|
| ___ ١. گیانەوەرێکن هەموو ژیانیان لە ئاودا بەسەر دەبەن. | أ ڕووەکی سادە |
| ٢. بەشێکە لەلەش، ئۆکسجین لەئاو وەردەگرن. | ب تۆو |
| ___ ٣. گیانەوەرن بەموویان بەفەروو داپۆشراون. | ج ڕووان |
| ___ ٤. گیانەوەرن لەشیان بەپەڕ داپۆشراوە. | د نێرەك |
| ___ ٥. رووەکی بێ ڕەگ و قەد و گەڵان | هـ کەرپەلە((مێیەك)) |
| ___ ٦. گیانەوەران لەسەر وشکانی دەژین پێستەکەیان وشکە بە پوولەکە داپۆشراوە . | و چەکەرە |
| ___ ٧. بەشی مێیەیە لە گوڵ. | ز وشکاوەکییەکان |
| ___ ٨. گیانەوەرێکن ژیانیان لەئاودا دەست پێ دەکات ئینجا دەچنە وشکانی. | ح باڵندەکان |
| | ط ماسییەکان |
| ___ ٩. بەشێکە لە ڕووەك، ڕووەکێکی نوێی لێ دەردەچێت. | ی ڕیشووەکان |
| ١٠. پارچەی بچووك و تەنکن ماسی دەپارێزن. | ك شیردەرەکان |
| ١١. چەند بەشێکن لە لەشی ماسی یارمەتی جوڵەی دەدەن. | ل پوولەکەکان |
| | م خشۆکەکان |
| ١٢. ئەو ڕووەکە بچووکەی کە لە تۆ دەردەچێت لەکاتی ڕوواندا. | س توێکڵ |
| | ع پەڕەکە |
| ١٣. چینی تەنك یان ئەستوورن لەشی خشۆکەکان دادەپۆشێت. | |
| ١٤. دەرچوونی ڕووەکی بچووك لە تۆودا. | |
| ___ ١٥. بەشی نێرەیە لە گوڵدا. | |

ناو ________________

ئەم نەخشەی چەمکانە بە جۆرەکانی ڕووەك پڕبکەرەوە، وە نموونەیان بۆ بهێنە.




ئەم نەخشەی چەمکانە بە سیفەتەکانی شیردەرەکان پڕبکەرەوە.




ئەم نەخشەی چەمکانە بە سیفەتەکانی باڵندە پڕبکەرەوە.



ڕێکخەری داتایی

ناو ________________

ئەم نەخشەی چەمکانە بە سیفەتە کانی وشکاوە کییە کان پڕبکەرەوە.




ئەم نەخشەی چەمکانە بە سیفەتە کانی ماسییە کان پڕبکەرەوە.




ئەم نەخشەی چەمکانە بە سیفەتە کانی خشۆکە کان پڕبکەرەوە.



ناو ________ بەروار ________

## یەکەی یەکەم بەندی ٢ • ڕێکخەری ڕوونکردنەوەی چەمکەکانی بەند

### زیندەوەران لە کوێ دەژین؟

| وانەی ١<br>ژینگەی بیابانی چییە؟ | وانەی ٢<br>ژینگەی شاخاوی چییە؟ | وانەی ٣<br>ژینگەی ئاوی چییە؟ |
|---|---|---|
| ١. ژینگە بریتییە لە ________<br>________<br>٢. سیفەتەکانی بیابان<br>بڕی باران ________<br>________<br>پلەی گەرمی: ________<br>________<br>٢. خۆگونجاندنەکانی ڕووەك<br>________<br>________<br>________ | ١. چینەکانی ژینگەی شاخاوی<br>________<br>________<br>________<br>________<br>________<br>٢. خۆگونجاندنەکانی گیانەوەران<br>________<br>________<br>________<br>________<br>________ | ١. ژینگەی ئاوی سازگار<br>________<br>________<br>________<br>٢. ژینگەی ئاوی سوێر<br>________<br>________<br>________<br>________<br>________ |

تۆماری لێکۆڵینەوە

ناو ___________________

بەروار ___________________

# ژینگە یەکی بیابانی دروست بکە.

**کەرەستە کان**



سندووقێکی موقەبا



بابۆڵەیەك لە کاغەزی نایلۆن



گڵی لمی



دوو یان سێ ڕووەکی بیابانی



تاوێری بچووك

## هەنگاوە کانی چالاکی

١ نموونەیەك دروست بکە بۆ ژینگەی بیابانی. بەناوپۆشکردنی سندوقەکە بە کاغەزی نایلۆن دەست پێ بکە. گڵی لمی لەناو سندوقەکە دابنێ دڵنیابە لە قووڵی لمەکە بۆ داگیرکردنی ڕووەکەکان.

٢ ڕووەکەکان بچێنە ناوگڵەکە و تاوێرەکان لەدەورەی دابەش بکە کەمێك ئاو بپرژێنە سەر گڵەکە.

٣ نموونەی ژینگە بیابانیەکەی تایبەت بەخۆت لە شوێنێکی خۆرەتاو دابنێ.

٤ **تێبینی** وشکبوونەوەی گڵەکە بکە، بەبەکارهێنانی پەنجەکانت، ڕۆژی یەك جار ئەگەر گڵەکە بەتەواوی وشك بۆتەوە ئەوا کەمێك ئاو بپرژێنە سەری. ئاگاداربە ڕووەکەکان زۆر ئاو نەدەیت.

٥ بەدواداچوون، تێبینی ژینگەی بیابانیەکەت بکە و گرنگی پێ بدە، چی تێبینی دەکەیت تۆماریبکە. ___________________

**تێبینیە کانم:** ___________________

___________________

تۆماری لێکۆڵینەوە

ناو ____________________

## دەرئەنجام بکە

١. ئەو نموونەیەی کە دروستت کردووە، کام جۆر ژینگە دەنوێنێ؟

________________________________________

________________________________________

٢. **دروستکردنی نموونە** چۆن یارمەتیت دەدات لە فێربوون دەربارەی بیابان.

________________________________________

________________________________________

٣. **زاناکان چۆن کاردەکەن**: زانایان بە زۆری لەمیانەی **دروستکردنی نموونەکان** فێردەبن کام جۆری تر لە ژینگەکان بێجگە لە ژینگەی بیابانی دەتوانیت نموونەی بۆ دروست بکەیت؟

________________________________________

________________________________________

ناو ________________

بەروار ________________

# نموونەیەك دروست بکە

هەندێ جار ئارەزوو دەکەیت کە شتێکی زۆر گەورە ببینیت بۆ ئەم مەبەستە نموونەیەکی بچووکی بۆ دروست بکە ، لەجیاتی شتەکە سەیری ئەم نموونەیە بکە .

## بیربکەرەوە لە دروست کردنی نموونەیەك

تۆ لەهاویندا لەناوچەی گەرم و وشك و لەزستانیشدا فێنك و باراناویدا دەژیت وادابنێ دەتەوێت نموونەیەکی ژینگەی بیابان لە باخچەی ماڵەکەت دروست بکەیت ، ئەمەش لەگەرمترین ڕۆژەکانی هاویندا دروستی دەکەیت ، هەندێك ڕووەکی بیابان لە خاکێکی لماوی دەچێنیت ، هەموو ڕۆژێك تیشکە سووتێنەرەکەی خۆر لە ژینگەکەت دەدات. تۆ ڕووەکەکان بەچەند دڵۆپێك ئاو ، ئاودەدەیت ، سێ جار لە هەفتەیەکدا ڕووەکەکان بە باشی دەڕوێت، پاشان وەرزی هاوین کۆتایی دێت، و نموونەی ژینگەکەت دەست بەگۆڕان دەکات.

١. مەبەست لە نموونەیەکی دیاریکراو چییە ؟ ________________

________________

٢. ئەم نموونەیە چیت فێر دەکات ؟ ________________

________________

٣. لات وایە لەکۆتایی وەرزی هاویندا چی لە نموونەکەت ڕوو دەدات؟

________________

________________

٤. وێنەی ئەو ژینگە بیابانیە بکێشە کە نموونەیەکی بۆ دروست کردووە لە باخچەی ماڵەوەت.

پێداچوونەوەی چەمکەکان

ناو ____________________

بەروار ____________________



# ژینگەی بیابان چییە ؟

## چەمکەکانی وانەکە

بیابان ژینگەیەکە لەو ناوچانەدا هەیە کەبارانی زۆر کەمە. لە تەك بیاباندا ناوچەی نیمچە بیابانی هەیە کە بڕێکی زیاتر لە بارانی لێ دەبارێت.

## زاراوەکان

| | |
|---|---|
| ژینگە (٤٢) | بیابان(٤٢) |

**بۆشاییەکە بە پێتی وەڵامی ڕاست پڕبکەوە.**

١. دەشێت پلەی گەرمی بیابانی گەرم لە ڕۆژدا زیاتر بێت لە ______
**أ**. ٢٣ پلەی سەدی **ب**. ٤٥ پلەی سەدی

٢. ئەو ژینگەیەی دەوری زیندەوەرێك دەدات ئەمانە دەگرێتەوە ______
**أ**. زیندەوەران **ب**. زیندەوەرو شتی نازیندوو

٣. ڕووەکی سوبێر بەشی وای هەیە یارمەتی دەدات بۆ ژیانی لە بیابانە گەرمەکاندا ، بەڵام ڕووەکی سوبێر ______ ی نیە .
**أ**. بەرگی ئەستوور **ب**. ڕەگی زۆر قووڵ
**ج**. قەدی ئەستوور **د**. ڕەگی نزیك ڕووی زەوی.

٤. گیانەوەرەکانی بیابان زۆر ترینی ئەو ئاوەی پێویستییان پێی هەیە لە خواردنی ڕووەکەکان، یان لە خواردنی ______ دەست دەکەوێت.
**أ**. بەرەکان **ب**. سەوزە
**ج**. گیانەوەرانی تر **د**. شکێنراوەکان

٥. ناوچەکانی نیمچە بیابانی دابەش دەبن ______
**أ**. لە دەورووبەری ڕووبارەکان **ب**. لەتەك بیابانەکاندا
**ج**. لە دەورووبەری دەریاکاندا **د**. لە ناوەڕاستی بیاباندا.

٦. ئەگەر ویستت کەروێشك لە بیاباندا ببینی، ئایا بە ڕۆژ یان بە شەو لێیان دەگەڕێیت؟ ئەمە ڕوونبکەرەوە. ______________________________

______________________________

تۆماری لێکۆڵینەوە

ناو ____________

بەروار ____________

# ژینگەیەکی شاخاوی دروست بکە

## کەرەستەکان



**قوڕی ڕەنگا و ڕەنگ (قاوەیی، قاوەیی کراوە، سەوز، خۆڵەمێشی، سپی) «قوڕی دەستکرد»**



**پارچەیەکی پان لە مقەبا**



**ڕووەکی پلاستیکی بچووک (کاژ، سەرو، بەڕو) یان وێنەکانیان**



**٥ خانووی بچووک**

## هەنگاوەکانی چالاکی

❶ ژینگەیەکی شاخاوی دروست بکە. قوڕی قاوەی لەسەر پارچە مقەبایەکە درێژ بکە بە شێوەی بازنەیی و وە بە ئەستووری دوو سانتیمەتر وە لێوارەکانی لار بکە.

❷ قوڕەکەی دیکە بە شێوەی چین دابنێ لەسەر چینەکەی ژێرەوەیان کە بەرەبەرە تەسك تربێ، بەم شێوەیە، قاوەیی کراوە، لە دوایدا سەوز و خۆڵەمێشی ئینجا سپی لە لوتکەکەیدا. وە لێوارەکانی چینەکان با لار بێت، بەمەش نموونەی شاخێك یان چیایێك دروست دەبێ.

❸ خانووە بچووکەکان لە لێوارەکانی چینی ژێرەوە بچەسپێنە.

❹ لە ١٠ بۆ ١٥ ڕووەکی بەڕو لەسەر چینی ژێرەوە بچەسپێنە.

❺ لە ٨ بۆ ١٠ ڕووەکی کاژ و سەرو لە لێوارەکانی چینی سێیەم بچەسپێنە.

❻ هەردوو چینەکانی پێنجەم و شەشەم بەبێ ڕووەك جێیان بهێڵە. بەم شێوەیە نموونەیەك بەدەست دەکەوێت کە ڕووەکەکان لە ژینگەی شاخاویدا دابەشکراون.

تۆماری لێکۆڵینەوە

ناو ____________________

## دەرئەنجام بکە

١. هۆی جیاوازی جۆرەکانی دارستانەکان لە نێوان چینەکانی ژینگەی شاخاوی چییە؟

___________________________________

___________________________________

___________________________________

___________________________________

٢. بۆچی ژمارەی ڕووەك کەم دەبێت لە چینەکانی سەرەوەی ژینگەی شاخاویدا؟

___________________________________

___________________________________

___________________________________

___________________________________

٣. بۆچی بەرزترین ناوچە لە شاخدا بە قوڕی سپی دروستکراوە؟

___________________________________

___________________________________

___________________________________

٤. **زاناکان چۆن کاردەکەن**: زاناکان فێردەبن لەکاتی دروستکردنی نموونەکان. چی فێردەبێت لە ناوچەکانی دارستان لەم نموونەیەدا؟

___________________________________

___________________________________

___________________________________

___________________________________

ناو ____________________

بەروار ____________________

# نموونەیەك دروست بكە

لەوکاتەی کە نەتوانی لە شتێکی گەورە بزانی، دەکرێ شتێك دروست بکەیت لەوبچێیت کە پێیدەڵێن نموونە. بە بەکارهێنانی نموونەکە دەتوانی زۆر شت لە پێکهاتەی شتە راستەقینەکە بزانی.

## بیر لە دروستکردنی نموونەیەك بکەرەوە

دەتەوێ نموونەیەك دروست بکەی لەسەر ژینگەی شاخاویدا، بۆ چیایێك کە بەرزی ١٥٠٠مەترە. چیایەکە لە چەند چینێك دروستی دەکەیت هەروەك کە لە چالاکی «لێبکۆڵەوە» هاتووە لەم وانەیەدا. لە چینەکانی ئەم نموونەیە ئەو ڕووەکانە دەچەقێنی کە دەکرێ گەشە بکەن و هەوڵ دەدەیت کە ژمارەیەکی زۆرتر لە ڕووەکەکان لە نموونەی چیایەکە بچەقێنیت.

١. بەرزی ئەو چیایەی کە دروست کردووە چەند دەبێت؟

____________________

٢. ریزبەندی چینەکانی ڕووەکەکان لەم چیایە چۆن دەبێت؟

____________________

____________________

٣. چەند ڕووەك دەچەقێنیت لە هەر چینێکدا؟

____________________

٤. ئەگەر بەرزی نموونەکە یەك مەتر بێت، دەبێ درێژی هە ڕووەکێك کە دەیچەقێنی زیاتر لە ٥ ملیمەتر نەبێت. ئایا ڕووەکەکانت درێژترن یان کورت ترن؟

____________________

٥. تۆ و هاوڕێکانت چی فێردەبن لەم نموونەیە؟

____________________

پێداچوونەوەی
چەمکەکان

ناو ______________________

بەروار ______________________

# ژینگەی شاخاوی چییە؟

## چەمکەکانی وانەکە

ژینگەی شاخاوی ناوچەی بەرزن لەسەر ئاستی دەریاوە. وە پلەی گەرمی نزم دەبێت لەگەڵ بەرزاییدا.

## زاراوەکان

**هێڵی بەفری بەردەوام** (٤٨) **دارستانی گەڵا وەریوەکان** (٤٩) **دارستانە قوچەکییەکان**(٤٩)

**ئەم بۆشاییانە بەپیتی وەڵامی راست پڕ بکەرەوە.**

١. لە ژینگەیەکی شاخاویدا هەرچەند بەرزبین ساردی هەوا ______

**أ**. کەم دەبێت **ب**. زیاد دەبێت **ج**. دەگۆڕێت **د**. ناگۆڕێت.

٢. بڕی دابارینەکان لە چیادا ______ بڕی دابارین لە ناوچەکانی نزیك کە شاخاوی نین

**أ**. زیاتر لە **ب**. کەمتر لە **ج**. وەك ئەوە **د**. نیوەیەی.

٣. لە بەشەکانی خوارەوەی شاخەکانی هەرێمی کوردستان چینێك لە ______ گەشە دەکات .

**أ**. دارستانی قوچەکییەکان **ب**. بەڕووی ئاسایی **ج**. رووەکی کاژ **د**. حەزازییەکان.

٤. لەبەرچی ڕووەك لەسەر هێڵی بەفری بەردەوام گەشە ناکات؟

______________________________

______________________________

٥. لە وەرزی زستاندا ئەو گیانەوەرانەی لە ناوچە بەرزەکانی چیا دەژین لە کوێدا دەبن؟

وەڵامەکەت روون بکەرەوە. ______________________

______________________________

______________________________

______________________________

تۆماری لێکۆڵینەوە

ناو ______________________

بەروار ______________________

# ژینگەیەکی ئاوی سازگار دروست بکە

## کەرەستەکان


حەوزێکی ماسی
یان ئامانێکی ڕوونی پلاستیك


چەو


لم


کاغەز


ئاوی سازگار


ڕووەك لە ئاوی
سازگاردا دەژی


تاوێر


ماسی

## هەنگاوەکانی چالاکی

١. بنی حەوزەکە بە چینێك چەو داپۆشە . چینێکی لمی بەسەردا بکە.

٢. حەوزەکە لەشوێنێکی کەمێك خۆرەتاو دابنێ پەڕەکاغەزەکە لەسەر لمەکە دابنێ لەسەرخۆ ئاوەکە بکەرە حەوزەکەوە ، دڵنیابە لە ئاوەکە بەسەر پەڕەکاغەزەکەدا دەرژێنیت بۆ ئەوەی لمەکە لە شوێنی خۆی دا بمێنێتەوە.

٣. پەڕەکاغەزەکە دەربهێنە ، ڕووەکەکان بچەقێنە وکەڤرەکان لە حەوزەکە دا دابنێ، حەوزەکە بۆ هەفتەیەك واز لێ بێنە تا جێگەی خۆی دەگرێت پاش هەفتەکە ماسیەکانی تێ بکە .

٤. تێبینی ئەم ژینگە ئاوە سازگارە بکە و گرینگی پێبدە.

ناو ____________________

## دەرئەنجام بکە

١. هەندێ شت کە **تێبینیت کردووە** لە ژینگەی ئاوی سازگاردا کامانەن ؟

____________________

____________________

____________________

____________________

٢. بەڕای تۆ بۆچی ماوەیەك چاوەڕوانت کرد پێش ئەوەی ماسییەکان بخەیتە ناو حەوزەکەوە؟ ____________________

____________________

____________________

____________________

٣. **زاناکان چۆن کاردەکەن** زۆر جار **زاناکان نموونەی** ژینگەیەك دروست دەکەن بۆ ئەوەی لە تاقیگەکەدا **سەرنجی بدەن**. دروست کردنی ئەم نموونەیە چۆن یارمەتی دایت لەسەر تێبینی کردنی ژینگەی ئاوی سازگار ئەم نموونەیەی کە دروست کرد لە چیدا جیاوازە لەگەل گۆمێکی ڕاستەقینەیە؟

____________________

____________________

____________________

ناو ______________

بەروار ______________

# نموونەیەك دروست بکە

دەتوانی نموونەی شتێك دروست بکەیت بۆ ئەوەی تێبینی ئەو شتە بکەیت کە ناتوانی لە پۆلدابیبینیت، کاتێك نموونەیەك دروست دەکەیت دەبێت زۆر بە هۆشیاری بیکەیت ، ئەگینا نموونەکە بێ کەڵك دەبێت.

## بیرلە دروست کردنی نموونەیەك بکەرەوە

(شێرکۆ) نموونەیەکی ژینگەی ئاوی سازگاری دروست کرد ، چینێ چەوی لەبنی ئامانێکی گەورەدا دانا کەلە پلاستیکی ڕوون دروست کرابوو. چینێك لمی کرد بەسەردا ، پاشان ئاوی کردە ناوحەوزەکەوە ، لمەکە لە شوێنی خۆی بە جێگیری نەمایەوە بەڵکو ئاوەکەی لێڵکرد، شێرکۆ دەبووایە سەرلەنوێ دەست پێ بکاتەوە پەڕەیەکی لەسەر «لم»ەکە دانا و ئاوەکەی کردە حەوزەکەوە ، ئینجا ڕووەك و تاوێرەکانی لەسەر کاغەزەکە دانا. کاتێك کارەکەی خۆی بینی بۆی دەرکەوت پێویستە تاوێر و ڕووەکەکان لە حەوزەکە دەربینێت بۆ جارێکی تر پەڕەکەی لە حەوزەکە دەرهێنا ئینجا تاوێر و ڕووەکەکانی خستە حەوزەکەوە. ئینجا ماسییەکانی لەحەوزەکەدا دانا، ماسییەکان لە بارێکی باشدا نەبوون. دەری هێنان و خستنیە حەوزێکی ترەوە. شیرکۆ بۆ ماوەی هەفتەیەك وازی لە ئاوەکە هێنا ئینجا ماسییەکانی کردەوە ناو حەوزەکە، باری ماسییەکان باش بوون.

١. شێرکۆ چ هەڵەیەکی کرد؟ کاتێك نموونەی ژینگەی ئاوی سازگاری دروست کرد؟

______________________________

______________________________

٢. دەری بخە و بۆچی ماسییەکان بارو دۆخیان باش نەبوو کاتێك شێرکۆ لەحەوزەکەدا دایناوبوون ، بێ ئەوەی چاوەڕوانی بکات بۆ ماوەی هەفتەیەك ؟

______________________________

______________________________

٣. ئەو قۆناغە ڕاستانە بنووسە کە بۆ دروستکردنی نموونەی ژینگەی ئاوی سازگار پێویستن.

______________________________

______________________________

پێداچوونەوەی چەمکەکان

ناو ____________

بەروار ____________



# ژینگە ئاوییەکان چین؟

## چەمکەکانی وانەکە

ژینگە ئاوییەکان ئاوێکی سوێر، یان ئاوێکی سازگاریان تێدایە .

## زاراوەکان

| | |
|---|---|
| **ئاوە سوێرەکان (٥٦)** | **ئاوە سازگارەکان (٥٦)** |

**راستەهێڵێك بەژێر وەڵامی ڕاستدا بکێشە.**

١. چوویت بۆ گەشتی باخچەیەکی ئاوی کە نزیك بێت لە زەریاوە، نمایشێکت بینی بۆ گیایەکانی دەریا بە درێژایی ١٠ مەتر. کامە ژینگەت بینیووە لەوێدا؟

**أ**. ژینگەی ئاوی سازگار　　**ب**. ژینگەی ئاوی سوێر

٢. لە باخچە ئاوییەکەدا فلیمێکت لەسەر ژینگەکان بینی ، خەڵك مەلەیان دەکرد ، کاتێك لەمەلەکردن بوونەوە ، بینیت کە ئاوەکە وەستاوە هەروەها دیسان بینیت کەکیسەڵەکان لە ڕۆخی ئاوەکەوە مەلەیان دەکرد . جۆری ئەم ژینگەیە چییە؟ چۆنت زانی ؟

____________________

____________________

____________________

____________________

____________________

ناو ________________

بەروار ________________

# زاراوەکان بناسە

**وەڵامی گونجاو بۆهەر ڕستەیەك هەڵبژێرە و ئەو ڕستەیە بنووسە کە لەگەڵی دەگونجێت.**

| | | | |
|---|---|---|---|
| ____ | ١. ئاوێك خوێی زۆری تێدا بێت. | أ | ئاوی سازگار |
| | ٢. ژینگەیەك ، بارانێکی کەمی تێدا ببارێت. | ب | بیابان |
| ____ | ٣. هەموو شتێکی دەوروبەری زیندەوەر . | ج | هێڵی بەفری بەردەوام |
| ____ | ٤. ئاوێك کەبڕێکی کەمی لەخوێی تێدا بێت . | د | دارستانە گەڵا وەریوەکان |
| ____ | ٥. بەفر لەم بەرزاییەدا ون نابێ. | هـ | دارستانە قوچەکییەکان |
| | ٦. ژینگەیەکە، ڕەگی هەندی لە ڕووەکەکانی بەسەر ڕووی خاکەکەی بڵاو دەبێتەوە. | و | ژینگە |
| | ٧. ئەو ئاوەیە کە گۆم و ڕووبارەکانی لێ پێکدێت. | ز | ئاوی سوێر |
| ____ | ٨. ئەو درەختانەی کە بە درێژایی ساڵ گەڵاکانیان ناوەرێت. | | |
| | ٩. ئەو درەختانەی کە لە وەرزی زستان بێ گەڵا دەبن. | | |

ناو ______________________

ئەم نەخشەی چەمکانە بە خۆگونجاندنەکانی ڕووەکەکانی بیابانی پڕبکەرەوە.




ئەم نەخشەی چەمکانە بە خۆگونجاندنەکانی گیانەوەرەکانی بیابانی پڕبکەرەوە.



ڕێکخەری داتایی

ناو ______________________

ئەم نەخشەی چەمکانە بە خۆگونجاندنەکانی ڕووەکەکانی ژینگەی شاخاوی پڕبکەرەوە، وە نموونەیان بۆ بهێنە.



ڕێکخەری داتایی

ناو ________________

ئەم نەخشەی چەمکانە بە جۆرەکانی گیانەوەرانی ژینگەی شاخاوی پڕبکەرەوە، وە نموونەیان بۆ بهێنە.




ئەم نەخشەی چەمکانە لە جۆرەکانی ژینگەکانی ئاوی پڕبکەرەوە، وە نموونەیان بۆ بهێنە.



**ڕێکخەری داتایی**

ناو ______________________

**ئەم خشتەیە تەواو بکە بە سیفەتی ناوچەکانی زەریایی جیاواز.**

| ناوچە | سوێری | گەرمی | ڕوناکی |
|---|---|---|---|
| ئاوی لێوارەکان | | | |
| ئاوی قوڵایی ناوەند | | | |
| ئاوی زۆر قوڵ | | | |

**شێوەی ڤن بە بارەکانی لێك چوون و جیاوازی لە نێوان ژینگەی زەریا و ژینگەی گۆماو پڕبکەرەوە.**



ناو ________ بەروار ________



## زیندەوەرەکان پشت بە یەکتری دەبەستن

### وانەی ١ چۆن زیندەوەرەکان خواردنیان دەست دەکەوێت؟

________ زیندەوەرەکان لەگەڵ ژینگەکانیاندا بەدەست دەکەوێ.

- لەگەڵ ________ ڕووناکی و هەواو ئاو کارلێك دەکات بۆئەوەی خۆراکەکەی بەرهەم بێنێت
- گیانەوەران ________ کە زیندەوەرانی تر دەخۆن
- ________ ئەو زیندەوەرانە دەخوات کە پێشتر زیندوو بوون

### وانەی ٢ زنجیرەی خۆراك چییە؟

- ________ پیشانی دەدات کەچۆن خۆراك وزە لە زیندەوەرێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ زیندەوەرێکی دیکە
- ________ پیشانی دەدات کەچۆن وزە کەم دەکات کاتێك کە بەرز دەبین لە زنجیرەی خۆراکدا

تۆماری لێکۆڵینەوە

ناو ________________

بەروار ________________

# ددانی گیانەوەران

## کەرستەکان



کارتی پێرستکردن



کتێب دەربارەی گیانەوەران

## هەنگاوەکانی چالاکی

١. وێنەی گیانەوەران **تێبنی بکە** بەوردی سەیری شێوەی ددانی هەر گیانەوەرێك بکە.

٢. کارتی پێرستکردن بەکاربێنە بۆ هەرگیانەوەرێك ، لە سەر کارتەکە ناوی گیانەوەرەکە بنووسە و شێوەی ددانەکانی بکێشە.

٣. لەگەڵ هەڤاڵێکت دا لیستێك ئامادە بکە بەو وشانەی کە وەسفی شێوەی ددانەکانی دەکەن. ئەم وشانە لەسەرکارتی پێرستکردنی بنووسە لەتەنیشت وێنە گونجاوەکان.

٤. بیربکەوە لەو شتانەی کە هەر گیانەوەرێك دەیخوات. کتێبەکانی تایبەت بە گیانەوەران بەکار بێنە ئەگەر پێویستت بوو . لەسەر پشتی کارتەکە بە لیستێك ئەو شتانەی کە هەر گیانەوەرێك دەیخوات بنووسە.



تۆماری لێكۆڵینەوە

ناو ______________________

## دەرئەنجام بكە

١. كام گیانەوەر ددانی بەكاردێنێت بۆ ڕاوكردنی گیانەوەرانی تر؟ كام گیانەوەر ددانی خۆی بەكاردێنیێ بۆخواردنی ڕووەكەكان ؟ باسی بكە.

______________________

______________________

______________________

٢. هەندێك گیانەوەر ددانی خۆی بەكار دێنی بۆ ئەنجامدانی هەندیێ شتی دیكە تێبینی ددانی قوندوس بكە كە چۆن ددانەكانی یارمەتی دەدات، بۆ بڕینی درەختەكان كە بەكاری دەهێنیێ بۆ دروست كردنی ماڵەكەی.

______________________

______________________

٣. **زاناكان چۆن كاردەكەن** زانایان بە تێبینی كردن فێردەبن كە چۆن گیانەوەران ددانی خۆیان بەكاردێنن كاتێك دەبێت چاودێری چۆنیەتی خواردنیان دەكەن و چی دەخۆن؟ ئەوەی لەم چالاكیەدا تێبینت كرد لە بارەی شێوەی ددانی گیانەوەران چیت بۆ دەردەكەوێت؟

______________________

______________________

______________________

______________________

______________________

كارامەییە كردەییەكانی
زانست

ناو ________

بەروار ________

# تێبینی بكە و دەری بخە

كاتێك تێبینی دەكەیت ئەوا هەستیارەكانت بەكار دێنیت و كاتێك بەڵگە دەهێنیتەوە لەسەر ئەوەی تێبینیت كردووە ڕا دروست دەكەیت ئەمەش بە پشت بەستن بەوەی كە تێبینیت كردووە.

## بیربكەوە لەسەرنجدان و بەڵگە كانت

لەگەڵ پۆلەكەت لە گەشتێكدا سەردانی مۆزەخانەی مێژووی سروشتیت كرد. نمایشێكی گورگەكانت لە شوێنی سروشتیی خۆیان تێبینی كرد دانە تیژەكانی پێشەوەی گورگەكانت دی. وە لە نمایشێكی تردا وێنەی كێلگەی مانگاكانت دیت و زانیت كە مانگاكان ددانی پانیان هەیە خواردن دەهاڕێت بەڵام لە نمایشی كۆتاییدا ٣٢ ددان لە دەمی كەسێكی پێگەیشتوو دیاركەوت . زانیت كە ددانەكانی پێشەوە خواردن دەبڕن، و ئەو ددانانەی هاوسێی«جیران» ئەوانن كە تیژن و خواردن وبجر دەكەن، بەڵام ددانەكانی دواوە «پاشەوە» ڕوویەكی پانیان هەیە بۆ هاڕینی خواردن.

١. بیر بكەوە لە ددانەكانی مانگا چی دەردەخەیت دەربارەی ئەو شتانەی مانگا دەیخوات؟ ________

________

________

٢. چی دەردەخەیت دەربارەی فەرمانی ددانەكانی پێشەوەی مرۆڤ؟

________

٣. پاش سەرنجدانت بۆ ددانەكانی گیانەوەر، بیربكەوە لە گیانەوەرێك كە تەنها ڕووەك بخوات ، وێنەیەك بكێشە تێیدا ددانەكانی ئەم گیانەوەرە دەربخات، ڕوونی بكەوە، چی دەخوات؟

پێداچوونەوەی چەمکەکان

ناو ____________

بەروار ____________

# چۆن زیندەوەران خۆراکیان دەست دەکەوێت؟

## چەمکەکانی وانەکە

ڕووەك و گیانەوەر، پشت بە ژینگەکەیان و هەریەکەیشیان بەوی تر دەبەستن بۆ بەدەستخستنی خۆراك.

## زاراوەکان

| | | |
|---|---|---|
| **کارلە یەك دەکات (٦٨)** | **ڕووەك خۆر (٦٩)** | **شیکەرەوە (٧٠)** |
| **بەرهەمهێن (٦٩)** | **گۆشت خۆر (٧٠)** | |
| **بەکارهێن (٦٩)** | **ڕووەك و گۆشت خۆر(٧٠)** | |

**بەزاراوەی گونجاو ئەم بۆشاییانە پڕ بکەوە.**

ڕووەك و گیانەوەر پێکەوە هەڵس و کەوت دەکەن یان ____________ لەگەڵ دەورو بەریاندا بۆ دابینکردنی پێویستییەکانیان، ڕووەك ____________ خۆی خۆراك بەرهەم دێنێت. گیانەوەر ____________ دەبێ ڕووەك و گیانەوەری تر بخوات، ____________ ئەو زیندەوەرەیە کە زیندەوەرانی تر لێك هەڵدەوەشێنێت دوایی مردنیان بۆ ئەوەی خۆراکیان دەست بکەوێت.

**نیشانەی ( ✔ ) لەبەردەم ڕستەی ڕاستدا دابنێ.**

____________ هەموو زیندەوەرێك پێویستی بە خۆراکە.

____________ ڕووەك لەگەڵ تیشکی خۆر و ئاو وهەوا کارلێك دەکات بۆ بەرهەمهێنانی خۆراك.

____________ ئەو گیانەوەرانەی ڕاوی نێچیر دەکەن کە دەیان خۆن چەند بەشێك لە لەشیاندا هەیە یارمەتییان دەدەن لە خۆراك پەیدا کردندا.

____________ ئەوانەن کە هەمەچەشن خۆرن، ڕووەك و گۆشت دەخۆن.

____________ گیانەوەری گۆشتخۆر ، ڕووەك دەخوات.

____________ گیانەوەری ڕووەکخۆر گیانەوەر دەخوات.

تۆماری لێکۆڵینەوە

ناو ______________

بەروار ______________

# نموونەی زنجیرەیەکی خۆراك دروست بکە

## کەرەستەکان



٤ خلۆکە دەزوو



کارتەکانی پێڕست کردن



شریتی لکێن



قەلەمی هێڵکاری

## هەنگاوەکانی چالاکی

١ کارتەکانی پێڕستکردن لە ١ بۆ٥ ڕەنووس بکە لە گۆشەی ڕاستی خوارەوە دا.

٢ وێنەی هەندێ گیا لەسەر کارتی ١ بکێشە ، وشەی گیاکان بنووسە وێنەی سیسرکێکی شەو لەسەر کارتی ٢ بکێشە وناوەکەی بنووسە ، وێنەی بۆقێك لەسەر کارتی ٣ بکێشەو ناوەکەی بنووسە، وێنەی مارێك لەسەر کارتی ٤ بکێشە و ناوەکەی بنووسە،وێنەی بازێك لەسەر کارتی ٥ بکێشە و ناوەکەی بنووسە.

٣ کارتەکان لەسەر یەك هێڵ ڕیز بکەو بە جۆرێك کارتی ١ یەکەم بێت ،و کارتی ٥ کۆتایی بێت ، شریتە لکێنەکەو دەزووەکە بۆ بەیەك گەیاندنی کارتەکان بەکار بهێنە.

٤ کارتە بەیەك گەێنراوەکان لەسەر مێزەکە بلاّو بکەرەوە . دەبینیت کە کارتەکان نموونەیەك پێکدەهێنن پێ ی دەگوترێ زنجیرەی خۆراك .

٥ لەگەڵ هاوڕێکتدا گفتوگۆ بکە کە چۆن هەر زیندەوەرێك لە زنجیرەی خۆراکدا خواردەمەنی خۆی دەست دەکەوێت، لە نموونەکەتدا ئەو زیندەوەرانەی کە بەرهەمهێنن دیاری بکە. دواتریش ،زیندەوەرە بەکارهێنەکان دیاری بکە

ناو ______________________

## دەرئەنجام بکە

١. لەنموونەکەتدا چ زیندەوەرێك لە کۆتایی زنجیرەی خۆراکدایە؟ بەڕای تۆ بۆچی ئەم جێگایە داگیردەکات؟

______________________

______________________

٢. بەرهەمهێن دەکەوێتە چ بەشێکی زنجیرە خۆراکەکە؟ بەڕای تۆ بۆچی ئەم جێگایە داگیردەکات؟ ______________________

______________________

______________________

٣. **زاناکان چۆن کاردەکەن؟** زاناکان **نموونە بەکاردێنن** تا یارمەتیان بدەن لە لێکوڵینەوەی ئەو شتانەی لە سروشتدا هەن . بەکارهێنانی نموونەی زنجیرەی خۆراك چۆن یارمەتیت دەدات لە تێگەیشتنی زیندەوەرەکان و ئەو خۆراکەی کە دەیخۆن؟

______________________

______________________

______________________

______________________

ناو ______________________

بەروار ______________________

# نموونەیەك دروست بكە

بەكارهێنانی نموونە یارمەتیت دەدات بۆ فێربوون دەربارەی شتێك كە ناتوانی لە سروشتدا تێبینی بكەیت.

## بیر لە دروست كردنی نموونەیەك بكەوە

بە بەكارهێنانی ئەم خشتەیەی خوارەوە ، دەتوانی نموونەی زنجیرەیەكی خۆراك دروست بكەیت . ناوی ئەو گیانەوەر و ڕووەكانەی دێن لە ئەستوونە گونجاوەكاندا بنووسە .
نەهەنگ، سەقاقووش باڵندەیەكی ماسیخۆرە، ماسییەكی بچووك، قەوزە، كە زیندەوەرێكی ئاوییە لە ڕووەك دەچێت.
ئەم وشانە بخەرە خشتەكەوە و وەڵامی پرسیارەكانیش بدەوە.

| بەرهەم هێنەكان | بەكارهێنەكان | زنجیرەی خۆراك |
|---|---|---|
| | | |
| | | |
| | | |

١. چی لە ئەستوونی بەكار هێنەكاندا دادەنێیت ؟ ______________________

______________________

٢. بەكارهێن چییە ؟ ______________________

______________________

٣. چی لە ئەستوونی بەرهەمهێنەكاندا دادەنێیت؟ ______________________

٤. بەرهەمهێن چییە ؟ ______________________

______________________

٥. لە ستوونی زنجیرەی خۆراكدا ئەم چوار زیندەوەرانەی كە ناوەكانیان لە دەقەكەی سەرەوەدا هاتووە دابنێ، ڕەنووسی ١ بنووسە لە تەنیشت ئەو گیانەوەرەی یان ئەو گیانەوەرانەی لە لووتكەی زنجیرەی خۆراكدا هەن. زیندەوەرەكانی دیكە ڕەنووس بكە بۆ ئەوەی ڕیزبوونەكەی لە زنجیرەی خۆراكدا نیشان بدەی .

ناو ______________

بەروار ______________

# زنجیرە خۆراکییەکان چیین؟

## چەمکەکانی وانەکە

زنجیرەی خۆراك ڕێڕەوی گواستنەوەی خۆراکە لە زیندەوەرێکەوە بۆ زیندەوەرێکی دیکەی ناو ژینگە.

## زاراوەکان

| | |
|---|---|
| زنجیرەی خۆراك (٧٤) | هەرەمی وزە(٧٦) |

**بەزاراوەی گونجاو بۆشایی پڕ بکەوە:**

هەموو زیندەوەرێك پێویستی بە وزە هەیە بۆ ئەوەی بژی . زیندوەرەکان لە خۆراکەوە وزەیان دەست دەکەوێت . بەرهەمهێنەکان وزە لە ڕۆژەوە وەردەگرن ، لەو خۆراکەدا کە بەرهەمی دێنن کۆی دەکەنەوە . گیانەوەرەکان ناتوانن خۆراکی خۆیان بەرهەم بهێنن. لەبەر ئەوە زیندەوەرانی تر دەخۆن.

______ نیشانی دەدات کە چۆن وزە لە ژینگە دا دەگوێزرێتەوە.

______ نموونەیەکە نیشانی دەدات کە چۆن بڕی وزە کەم دەبێتەوە لە ژینگەدا تاوەکو گیانەوەرەکە لە زنجیرەی خۆراکدا بەرەوکۆتایی بڕوات.

١. هێڵێك لەژێر وەڵامی ڕاست دابنێ. کەروێشك گیا دەخوات، باڵندە کرم دەخوات، هەردوو گیانەوەر ______ چونکە وزەیان لەو خۆراکەی کە دەیخوات بە دەست دەکەوێت.

بەکارهێن نێچیر بەرهەمهێن گۆشتخۆر

٢. قۆناغەکانی ئەم زنجیرە خۆراکە بە ڕیزکردنێکی ڕاست دابنێ ئەویش بەدانانی ڕەنووس بۆ هەر زیندەوەرێك بە ١ یان ٢ یان ٣ یان ٤ کە بەگیا دەست پێ بکە.


______


______


______


______

٣. وا دابنێ کە تۆ زەیتون و تەماتە لە ناو پارووەیەك دا داناوە ئایا سەرچاوەی ناوەڕۆك پارووەکە بەکارهێنن یان بەرهەمهێنن؟______________

